Story

بیرم لە ... خەونە سەیرەکە دەکردەوە
کەواتە لەدوای گۆڕ ژیانێکی دیکە هەیە
بەڵام خەسڵەتی سەرەکیم هێشتا لەناخمدامابوو
کەواتە ئەگەر دەبێت جارێکی دیکە هەبم
بیرمکردەوە - بەویستی کەسێکی دیکە
ئەوا دەبێت ژێردەستە و ریسوانەبم






دەزگای مەحمود زامدار
بۆ وەرگێڕان و وەشاندن




**لەبڵاوکراوەکانی کتێبخانەی (مەحمود زامدار)**

**زنجیرە (١)**

خەونی پیاوێکی پێکەنیناوی

ڤیۆدۆر دۆستیۆڤیسکی

بابەت: چیرۆك

وەرگێرانی: فەیسەڵ خەلیل

هەڵەچنی: هێمن مامەند

دیزاینی بەرگ: عەفان ئەحمەد

نرخ: ٢٥٠٠

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

چاپخانەی شەهاب - هەولێر

ژمارەی سپاردن: ٢٠١٧/٣٤٧ هەولێر – هەرێمی کوردستان

من پیاوێکی پێکەنیناوییم، ئێستا ئەوان بە شێت وەسفم دەکەن، بەڵام ئەم وەسفە لەوانەیە ئاستی من بەرز بکاتەوە، ئەگەرهاتوو واز لەوە بهێنن بە پێکەنیناوییم بزانن، وەك پێشتر وایان دەکرد. لەمەودوا لێیان توڕە نابم، هەموویان کەسانی باشن، هەرچەندە گاڵتە بەمن دەکەن.تەنانەت کاتێك وەها هەڵسوکەوت دەکەن باشتر دەبن. ئەگەر خەمم زۆر نەدەبوو، منیش کاتێك سەیری ئەوانم دەکرد، لەگەڵ ئەوان پێدەکەنیم- هەڵبەتە بە خۆم پێنەدەکەنیم- بەڵکو بۆئەوەی دڵخۆشیان بکەم، لەبەر ئەوە خەمم زۆرە ئەوان ئاگاداریی هەقیقەتەکە نین، کەچی من دەیزانم. باری ئەو کەسەش قورسە کە بەتەنیا هەقیقەتێك دەزانێ، ئەوان لەمە ناگەن.

نەخێر، تێناگەن.

لە رابـردوودا کاتێـک پێکەنینـاوی دەرکەوتـم زۆر ئـازارم چەشت. بۆچی دەڵێم دەرکەوتم. من پێکەنیناوی بووم، هەمیشە پێکەنینـاوی بـووم. ئەمە دەزانـم. لەوانەیە هەر لەکـاتی لە دایکبـوونمەوە وەهـا بـووم. لەوانەیە لە تەمەنـی حەوت سـاڵی ئەمەم زانیبـێ. دواتـر لە ناوەنـدی خوێنـدم و دوای ئەویـش لە زانکۆ، هەرچەنـدە زیـاتر فێـر دەبـووم. لەوە دڵنیـاتر دەبـووم کە پێکەنیناوییم. تەنانەت وەك ئەوە بوو خوێنـدنی زانکۆم هەمـوو بریتیی بێت لەوەی بۆم بسەلمێنێ مـن پێکەنینـاوییم و رازیـیم بکات- ئەمەش بەقەد قوڵبوونەوەم لە زانستەکان زیـاتر دەبـووم- کە پێکەنیناوییم جا لە زانست بێت یان ژیان. ساڵ لە دوای سـاڵ دڵنیـاییم زیـاتر دەبـوو لەوەی شـێوەم لە هەمـوو بوارەکـان پێکەنیناوییە. هەمووان بەمن پێکەنین، لەهەمـوو شوێنێك. ئەو خەڵکە نەیانـدەزانی کەسێك هەیە لە هەمـوو خەڵکی سـەر گۆی زەوی درك بەوە دەکات مـن چەنـدە پێکەنینـاوییم. ئەو کەسـەش خۆمم. ئەوە زۆر تورەی کردم کەسێك لەوان ئەمە نازانێت. لەم چەنـد سـاڵە شـکۆی خـودم گەشـەی کـردووە. ئەگەر رۆژێـك لە رۆژان ناچـار بـم لە بەرامـبەر کەسـێك دان بەوە بنـێم کە مـن

کەسـێکی پێکەنینـاوییم، ئەوا هەر ئێـوارەی هەمـان ڕۆژ کەللەسەری خۆم بە فیشەکێك دەپرژاند. چەند ئازارم چەشت بەوەی لەسـەردەمی هەرزەکـارییم بەرگەم نەدەگـرت. بـۆیە لە بەرامـبەر هاوڕێیـانم دانـم بەوە دەنـا کە پێکەنینـاوییم. بەڵام لەوەتەی بوومەتە گەنجێك — سـەرەڕای ئەوەی سـاڵ لەدوای ساڵ جۆرێیەتی سەیروسـەمەرەی خۆم دەناسـم- بە هەر هۆکارێکەوە بێت هێمن و دڵنیاترم.

تەواوی ئەمەش تەنها لەبەر نەزانـی تەواو بـوو لەبەرامـبەر ئەو حـاڵەتەم. لەوانەیە بـابەتەکە بۆ ئەو نەگبەتییە بگەرێتەوە کە لە ئەنجـامی حـاڵەتێکی بەهێزتـر لەمـن بەسـەرم زاڵ بـوو. حاڵەتێك کەتێیدا بە شێوەیەکی جێگیر و پتەو بەوە رازی بووم کە هیچ شتێك نییە لەم ژیانەدا شیاوی بایەخ بێت. ئەم بـابەتە لە رابردوودا تەنها گومانێك بوو، بەڵام دواتر بوو بەقەنـاعەتێکی تەواو، لەناکـاویش ئەمەم لەلا بـوو بە هەقیقەتێـك کە پاشگەزبوونەوەم بۆ نەبـوو. لە پڕ هەسـتم کـرد بەلای مـنەوە گرنگ نییە ئەم جیهانە هەیە یان نـیـە. بەهەمـوو هەسـتەکانم، هەستم دەکرد ( هیچ لەکاتی هاتنی من بوونی نەبووە). سـەرەتا وامـدەزانی گەلێـك شـت بەر لە بـوونی مـن هەبـووە، بەڵام دواتـر

درکـــم بەوە کـــرد، هـــیچ شـــتێك بـــوونی نەبـــووە. بەڵام بە هەرهۆکـــارێکەوە بێـــت ئەم بـــوونەم بـــۆ دەرکەوت، بەرە بەرە دڵنیابووم هەرگیز شتێك نابێت.

ئەو کـاتەش لە پـڕ وام لێهـاتووە لە خەڵـك تـوڕە نـابم، تەنانەت تێبینی بوونیان ناکەم.

ئەمەش لە چەنـدین شـتی زۆر بچـووك دەردەکەوت: بـۆ نمـوونە مـن کاتێـك بەڕێگـاوە دەڕۆم بەر خەڵـك دەکەوم، ئەم بابەتە بەهۆی ئەوە نییە من لەبیرکردنەوە نقووم ببووم: جا بیر لە چی دەکەمەوە، ڕۆژانێك بوو وازم لەوە هێنا بـوو بیـر لە شـتێك بـکەمەوە: هەمـوو بابەتەکـان بەبەرچـاومەوە وەك یەك بوو، وام لێهاتبوو بـایەخم بە بابەتێـك نەدەدا. بیـرم لە وەڵامـی تاکە پرسیارێکیش نەدەکردەوە؟ دواتـر ئایـا پرسـیارگەلێك هەیە سـەرقاڵم بکـات؟ بـایەخم بە هـیچ شـتێك نەدەدا. بـۆیە پرسیارەکانیش پەرتەوازە بوون و لێم دوورکەوتنەوە.

بەمشـــــێوەیە دوای ئەوەی هەمـــــوو ئەو شـــــتانە ڕابوورد.هەقیقەتەکەشم زانی، لە تشرینی دووەم، ڕێـك لە ڕۆژی سێیەم بـوو. لەو کـاتەوە ساتێك لە ساتەکانم لەبیـر نەکـردووە. ئەمە لەشەوێکی ئەنگوستەچاو بووم، شـەوێکم نەدیـووە هێنـدە

تاریـك بێـت. كـاتژمێر یـانزه بـوو.بەرەو مـاڵ دەگەڕامەوە. بە تەواوی لەبیـرمە دەمگـوت مەحـاڵە تـاریكیەكی وەهـا هەبێـت. تەنانەت لە رووی فیزیكیشەوە بێت. تەواوی رۆژ باران دەباری، بارانێك بـوو زۆرتـرین سـەرما و نائومێدی لەگەڵ بـوو. تەنـانەت هەڕەشە و دوژمنایەتی بوو بۆ خەڵك. ئەوەم لەبیرە. ئەوەتا لە ناكاو لە نزیك یانزەی شەو باران وەستا. بەمەش شێیەكی سارد، ساردتر لەوەی بـارانەكە دروسـتی كردبـوو كەوتە سـەرزەوی. تەمێك بەسەر شەقام بەرزدەبووەوە. كۆڵانەكانیشی داپۆشی بوو. ئەو كاتە وام دەزانی ئەگەر گڵۆپە گازەكان خامۆشبن. ئەوا مایەی شـادی دەبـن. چـونكە هەر بەم وێـنەیە هەمـوو خەمەكـان دەردەكەون و دەدرەوشـێنەوە. ئەو رۆژە نـانی نیـوەرۆم نەخوادربوو. سەر لە ئێوارە لەلای ئەندازیارێك دانیشتبووم دوو هـاوڕێی لەگەڵـدابوو. تەواوی دانیشـتنەكە مـن بێـدەنگ بـووم. ئەمەش مـایەی نیگەرانـی ئەوان بـوو لە مـن. قسـەیان لەسـەر چەنـدین بـابەتی سـەرنج ڕاكێش كـرد. دواتـر جۆش وخـرۆش بەسـەریان زاڵبـوو. لەراسـتیدا خۆیـان وا دەردەخست. بەلایـانەوە گرنـگ نەبـوو مشـتومڕیان لەسـەر چی دەكـرد. منـیش تێبینـی

ئەوەم کــرد و لە ناکــاو وتــم" بەڕێــزان، لەراســتیدا ئێــوە کەمتەرخەمن".

لە من توڕە نەبوون، بەڵکو هەموویان بەگاڵتەوە پێکەنین، لەوانەیە ئەوەی مـن گوتم بـێ هـیچ گلەیـیەك بێت، چونکە بە سادەییەکەی منیش بایەخم بەشتێك نەدەدا، بۆیە ئەمەیان بینی و دڵخۆش بوون. کاتێك خەیاڵم لەلای گڵۆپە گازەکان بوو، بەدەم ڕێگــاوە چــاوم بەرەو ئاســمان بەرزکــردەوە، زۆرتاریــك بــوو، بە ئاستەم دەتوانرا کەڵێنی هەورەکان لە یەکتـر جیا بکرێتەوە، لە پەڵەیەکــی رەش و قــوڵ، لە نێــو پەڵەکــانی ئاســمان تــوانیم ئەستێرەیەکی بچووك ببینم، دڵخۆش بووم بە هیوایەك سەیرم کــرد، ئەم ئەســتێرەیە بیرۆکەیەکــی لەلای مــن بێــدارکردەوە: لەو شەودا بڕیارم دا خۆم بکوژم. دوو مانگ بـووم مکوڕ بـووم لەوەی خۆم بکوژم، سەرەڕای هەژارییە کوشندەکەم دەمانچەیەکی ناوازەم کڕی و هەر ئەو رۆژە پڕم کرد لە فیشەك. دوو مانگ تێپەڕی و دەمانچەکەش لە چەکمەجەکە کەوتووە. لە کەمتەرخەمی خۆم، لە کۆتاییدا هیوای ئەوەم خواست تاکە خولەکێك هەبێت تێیدا هەســت بــکەم شــتێك شــایەنی بــایەخ نیــیە، بــۆچی؟ نــازانم،

بەمشێوەیە ماوەی دوومانگ بوو. هەموو ڕۆژێك دەگەڕامەوە ماڵ، بیرم لە خۆکوشتن دەکردەوە. چاوەڕوانی ساتێکی گونجاو بووم.

ئێستاش ئەم ئەستێرەیە ئەم بیرۆکەیەم پێدەبەخشێ. ئەم شەوە بە تایبەتی دەمەوێ ئەوە جێبەجێ بکەم کە بڕیارم لەسەرداوە. بۆچی ئەم ئەستێرەیە ئەو بیرۆکەیەی پێ بەخشیم نازانم!

تەواو لەو ساتەی سەیری ئاسمانم دەکرد. کیژۆڵەیەکی بچووك سەردەستی گرتم. ڕێگاکە چۆڵ ببوو. خەریك بوو کەس لە شەقام نەدەما. دوور لەمن گالیسەکەیەك وەستا بوو لێخۆرەکەی بێ ئاگاببوو. کیژۆڵەکە تەمەنی هەشت ساڵ دەبوو. سەری بەدەسماڵێکەوە داپۆشتبوو.تەنها کراسێکی پۆشی بوو. ئەویش تەواو تەڕ ببوو. کەوشە دڕاو و تەڕەکەی سەرنجی ڕاکێشام. هێشتا ئەو دیمەنەم لەبیرە. کاتێك پێیەکانی ئەوم بینی چاوەکانم ئەبلەق بوون. منداڵەکە سەردەستی منی ڕادەکێشا و داوای بە هاناچوونی لە من دەکرد. ئەو نەدەگریا. بەڵام لە بەر تۆڕییەکە ورتە ورتی بەچەند وشەیەك دەکرد. لەبەر سەرماو لەرزین نەیدەتوانی بەچاکی گوێ بکات. لە بەر بابەتێك تۆقیبوو. دواتر بە نائومێدی قیژاندی" دایکم، دایکە

خۆشەویستەکەم". ئاورێکم لێدایەوە بەڵام هیچم نەگوت و لە ڕێگای خۆم بەردەوام بووم. بەدوای من رایکرد، منی هەژاند، دەنگی وەك هەر منداڵێکی ترساو و تۆقیو بەرز دەبۆوە. من ئەو جۆرە دەنگە دەناسم. هەرچەندە ئەو هیچی نەگوتبوو، بەڵام مەزندەی ئەوەم دەکرد دایکی لە شوێنێك لەسەرمەرگ بێت، یان شتێکی ترسناك بەسەر هەردووکیان هاتبێ، بۆیە هاتووە تا کەسێك بە هانیان بچێت و هاوکاریان بکات. بەڵام من لەگەڵی نەرۆیشتم بەڵکو بیرۆکەی راونانیم هەبوو. لەسەرەتادا پێم گوت بەدوای پۆلیسێك بگەڕێت، بەڵام ئەو هەر زوو دەستە بچووکەکانی خۆی دەگرت و دەپاڕایەوە و لەتەك من دەرۆیشت. رەتی دەکردەوە وازم لێبهێنێ. ئەو کاتە پێم لە زەوی کوتا و دوورم خستەوە، دواتریش ڤیژاندی" بەرێزم، ئەی بەڕێزم". لە پڕێکا منی جێهێشت وەك تیرێك بۆی دەرچوو، بەرەو کەسێکی دیکە رۆیشت کە لەوبەری شۆستەکە بوو.

بەرەو نهۆمی پێنجەم رۆیشتم کە لەوێ نیشتەجێم، لە شوقیەکدا، ژوورەکەم بچووك و هەژارە، پەنجەرەیەکی تێدا نییە، تەنها دەلاقەیەکی بچووك نەبێت، ژوورێکی دانیشتن و مێزێك

که کتێبەکانی لەسەرە، دوو کورسی شڕ، بەڵام لە شێوازی ڤۆلتیر. دانیشتم و مۆمەکەم داگیرساند و کەوتمە بیرکردنەوە.

لە ژوورەکەی تەنیشتم هێشتا هەرا و بەزم بەردەوام بوو، کە سێ رۆژ دەبێت دەستی پێکردووە. لەو ژوورەدا کاپتنێکی خانەنشین دەژی، ئەمجارەیان شەش کەسی زۆڵ سەردانیان کردووە، ڤۆدگایان خواردۆتەوە و یاری (فیرعەون)یان بە کاغەزە کۆنەکان دەکرد.شەوی رابردوو شەڕ و دەمەقاڵێیان لەنێوان دروست بوو، دەزانم بۆماوەیەکی زۆر بوو دوو کەس لەوان قژی یەکتریان رادەکێشا. خاوەن ماڵەکە دەیویست سکاڵایان لەسەر تۆمار بکات، بەڵام ئەم ژنە زۆر لە کاپتن دەترسێ. جگە لە ئێمە کەسێکی دیکە نەبوو، تەنها خانمێکی بچکۆڵە و لاواز نەبێت، کە بێوەژنی یەکێك لە ئەفسەرەکان بوو. ئەو ژنە لەگەڵ سێ منداڵی بچووك هاتبووە ئەم ماڵە، منداڵەکانی هەر زوو نەخۆش کەوتن، زۆر لەکاپتن دەترسان، بۆیە ئەو وایان لێدەکات لەترسان بلەرزن و تەواوی شەو هێمای خاچ بکێشن. تەنانەت کوڕە هەرە بچووکەکەیان لە ترسان ورکی دەگرت.

من دەزانم کاپتن لە شەقامی نیڤسکی رێبوارانی دەوەستان و سواڵی دەکرد.

کەسێك نەبوو بۆ کارێك یان خزمەتێك بانگهێشتی کاپتن بکات. لەمەش سەیرتر (هەر ئەمەش وایکردووە لەبارەی کاپتن بدوێم) ئەوەبوو مانگێکی تەواو بەسەر ئەوە تێپەڕی کاپتن لەگەڵ ئێمە نیشتەجێ بوو. بەڵام لەبەرامبەر ئەودا هەستم بە هیچ بێزاراوییەك نەدەکرد. سەرەتا خۆم لەوە بەدوور دەگرت یەکتر بناسین. بەڵام ئەگەر بابەتێکی رووبدات. ئەوا پیاوەکە هەر لە دیداری یەکەم لەبەرامبەر من هەست بە بێزاریی و جاڕسبوون دەکات. جا من بایەخم بەم بابەتە نەدەدا. بۆیە هەرچەندە لە پشت دیوارەکەوە هاواریان دەکرد و ژمارەیان هەرچەندە بووایە. بابەتەکە بەلای منەوە وەك یەك بوو.

تەواوی شەو دادەنیشتم و لە راستیدا نە گوێم بۆ ئەوان دەگرت و نە گوێم بۆیان هەڵدەخست. بەڵکو تەواو بوونی ئەوانم لەبیر کردبوو. وا راهاتبووم تەواوی شەو لەسەر کورسییەکە لەبەرامبەر مێزەکە دابنیشم. بێئەوەی هیچ شتێك بکەم. سەبارەت بە خوێندنەوەش من تەنها لە رۆژدا دەمخوێندەوە. تەنها دادەنیشتم. بیرم نەدەکردەوە. بەڵام هەندێکجار هەندێك بیرۆکەم بە زەین دادێت. کە هەر زوو ئازادیان دەکەم بۆ ئەوەی بە خواستی خۆیان دەڕۆن.

ئەو شـەوە تەواوی مـۆمەكە سـووتا، منـیش بە بێـدەنگی لەبەرامـبەر مێـزەكە دانیشـتبووم. دەمـانچەكەم دەرهێنـا و بە بێـدەنگی لەبەردەمـم لەسـەر مێـزەكەم دانـا. بیـرم كەوتەوە ئەو كاتەی ئەم كارەم كرد لە خۆم پرسی:

" كەواتە بەمشـێوەیە؟" دواتـر وەڵامـی خـۆم دایەوە" بەڵـێ" خۆم دەكوژت. دەمزانی زۆرترین ئەگەر ئەوەبوو ئەو شـەوە خـۆم دەكـوژم، بەڵام بەر لەوەی ئەم كـارە ئەنجـام بـدەم تـاكەی لەسەركورسـیەكەم لەبەرامـبەر مێـزەكەم دادەنیشـم. نەمـدەزانی. بەلای منەوە گومانی تێدا نەبـوو ئەگەر ئەو شـەوە رێكەوتـی ئەو كیژۆڵەیەم نەكردبـووایە لەشـەقامەكە، ئەوا هەر ئەو شـەوە خـۆم دەكوشت.

هەرچەنـدە شـتەكانی دەوروبەرم بەلای مـنەوە بایەخیـان نەبـوو، بەڵام مـن – بۆ نمـوونە- هەستم بەئـازار دەكـرد. ئەگەر كەسێك لێم بـدات هەست بە ئـازار دەكەم، بـابەتەكە لە مەسـەلە ئاكاریی و ویژدانییەكان  هاوشێوەیە. كاتێك شتێكی خەمناك روو دەدات، هەسـت بە خەمێكـی قـوڵ دەكەم، وەك ئەو سـەردەمەی بـایەخم بە دونیـای دەوروبەرم دەدا. مـاوەیەك بەر لەئێسـتا هەستم بە بەزەیی كرد: لە توانـام هەبوو بێ دوودڵـی هاوكاریی

ئەم کیژۆڵە بچووکە بکەم. بەڵام بۆچی ئەم کارەم نەکرد؟ لەوانەیە ئەم بیرۆکەیە ئەو کاتە گەلالە ببوو. کە کچەکە دەستی دەگرتم و داوای فریاکەوتنی دەکرد. ئەم بیرۆکەیەش خۆی لەپرسیارێکی زەق بەرجەستە دەکرد کە لەناکاو چاوی گرت و نەمدەتوانی وەڵامی بدەمەوە. هەرچەندە پرسیارەکە لەجێی خۆی نەبوو. بەڵام تورەی کردم. بەهۆی دەرئەنجامەکەشی تورە بووم. کە دەڵێ: مادامەکی ئەمشەو کۆتایی بە ژیانم دەهێنم. وا باشترە لەم ساتانەدا زیاتر لە هەر کاتێکی دیکە کەمتر بایەخ بە ژیان بدەم. کەواتە بۆچی لە ناکاو بەزەییم بە کیژۆڵەکە دێتەوە و پێیوە سەرقاڵم؟ لەبیرمە من لە پێناوی ئەو خەمناك بووم و زۆریش بەزەییم پێی هاتەوە. ئەمەش لەگەڵ بارودۆخ و ئەو کارە یەکناگرێتەوە کە بەنیازی بووم. راستییەکەی...ناتوانم وێنەی ئەو هەست و سۆزەم بکێشم کە ئەو کات بەسەرم زاڵ بوو. هەست و سۆزێك بوو هەرگیز بەجێی نەهێشتم. کاتێکیش لەبەرامبەر مێزی ژوورەکە دانیشتم. تورەییم گڕی گرتبوو. وەك ئەوەی چەندین ساڵە بەمشێوەیە نەبووە. جا دادگایی عەقڵی یەك لەدوای یەك ئەنجام دەدرا و بابەتەکانم هەڵدەدایەوە: من کە هێشتا مرۆڤم و سفر نیم. هێشتا نەبوومەتە سفر. ئەمە

مانای ئەوەی من دەژیم. دوای ئەمەش دەکرێت ئازار بچێژم. تووڕە بم و لە کارە دزێوەکانم هەست بە شەرمەزاریی بکەم. باشە! ئەی ئەگەر خۆم کوشت. دوای دوو کاتژمێر بەلای منەوە چی دەبێت. چ لە بارەی کیژۆڵەکە. ئەی شەرمەزارییەکە. ئەی دەربارەی هەموو ئەو شتانەی لەسەر رووی زەوی هەن؟ ئەو کاتە من دەبمە سفر. دەبمە عەدەمێکی رەها.

ئایا ماقوڵە بابەتی درکپێکردنم ئەوەیە کە من دوای کەمێکی دیکە هەرگیز بوونم نابێت. بەرەهایی. دواتریش تەواوی جیهانیش بوونی نابێت. کەواتە ماقوڵە ئەم درکپێکردنەم بۆ کەمێکیش بێت. کاریگەریی بەسەر هەستم نەبوو تا هەست بە بەزەیی بکەم لەبەرامبەر ئەو کیژۆڵەیە. هەست بە بێویژدانی نەکەم لە بەرامبەر ئەو هەڵەیەی ئەنجامم داوە؟

کاتێک پێم لە زەوی کوتا و بەڕووی ئەو هاوارم کرد. سووکایەتیم بەم کیژۆڵە بەستەزمانە کرد. ئەمە چ چەپەڵییەك بوو ئەنجامم دا. کە خاڵی بوو لە هەموو هەست و سۆزێك" ئەم قسانەم بە ئامانجی ئەوە نەبوو تەنها ئەوە بسەلمێنم کە چیتر هەست بە بەزەیی ناکەم. بەڵکو لەبەر ئەوەش بوو تا بسەلمێنم. من هێشتا دەتوانم چەپەڵییەکی دیکە ئەنجام بدەم. بەر لەوەی

دوو کاتژمێری دیکە جیهان بەجێبهێڵێم. ئایا باوەڕ بەوە دەکەم، هاواری من هەر لە بەر ئەم هۆکارە بوو؟ ئێستا من خەریکە لەوە دڵنیا دەبم، زۆر بە ڕۆشنی وێنای ئەوەم کردووە. ژیان و جیهان ئێستا پەیوەستن بەمنەوە. تەنانەت دەتوانم بڵێم: وەك ئەوەیە جیهان تەنها بۆ من بوونی هەیە. تەنها ئەوەندە بەسە فیشەکێك بەخۆمەوە بنێم، تا جیهان ون ببێت و چیتر بوونی نەبێت. بەلایەنی کەمەوە بۆمن وا دەبێت. ئێستا ناڵێم لە دوای من شتێك نییە بۆ هەمووان بمێنێتەوە. هەر هێندەی هۆشی من خامۆش بێت، ئەوا تەواو جیهان گوم دەبێت. وەك ئەوەی تارماییەك بووبێت. چونکە هەموو ئەوانە پەیوەستن بە هۆشی منەوە. تەنها هۆشی من. لەوانەشە تەواوی جیهان و خەڵکیش هەموی تەنها (من) بن. من کە لە بەردەم مێزەکە دانیشتبووم، لەبیرمە هەموو ئەو پرسیارە نوێیانەم هەڵدەگێڕایەوە. بەرەو هەموو ڕێبازەکان ڕۆیشتم و ڕێبازی دیکەشم دادەهێنا.

هەر بۆ نموونە وێنای بابەتێکی نامۆم کرد. وەك ئەوەی من لە رابردوودا لەسەر رووی مانگ یان مەریخ ژیابم. لەوێش کۆمەڵێك کاری دزێو و چەپەڵم ئەنجام دابێت. ئەوەی ناکرێت وێنا بکرێت، شەرمەزارانە لە نەنگی تێوەگلاوم، بەشێوەیەك کە

ناتوانرێت خەیاڵ بکرێت تەنها لە دێوەزمەکان نەبێت. دواتـر لە لەناکـاو خـۆم لە سـەر گـۆی زەوی دۆزیـیەوە. لەگەڵ ئەو هەمـوو هەست و سۆز و کارانەی لەسەر هەسارەکە ئەنجامم داوە، کەچی بە هەر هۆکارێـك بێـت نـاتوانم بگەڕێـمەوە ئەوێ. مـن لە سـەر زەویـیەوە سـەیری مانـگ دەکەم، ئایـا هەسـت بە کەمتەرخەمـی دەکەم لە بەرامـبەر هەمـوو ئەو شـتانەی لەوێ روویـداوە؟ ئایـا هەسـت بە شـەرمەزاریی دەکەم لەوەی ئەنجـامم داوە؟ ئەمـانە چەند پرسیارێکی بێهوودەن، دەمـانچەکە لەسـەر مێـزەکە راکشاوە، دەبێت خۆم بکوژم، بەڵام ئەم پرسـیارانە گـرێ لە نـاخم بەرداوە، رێگریـی خۆکوشـتم لـێ دەکەن و داوای وەڵامـم لـێ دەکەن. بە کـورتییەکەی: ئەو کیـژۆڵە کە منـی رزگـارکرد و ئەو پرسـیارانە دەمـانچەکەی لەمـن دوورخسـتەوە. بـارودۆخی ژوورەکەی کـاپتن بەرەو هێمنی و بێـدەنگی دەرۆیشت، لە یـارییکردن وەستابوون، خۆیان بۆ خەوتن ئامادە دەکرد، تەنها دەنگی مـنگە منگێـك یـان چەند جنێوێکی جیا جیا لە ژوورەکەی ئەوان دەگەیشتە مـن. لە ناکاو دوور لە نەریتـی خـۆم کەوتـمە خەوەوە، خەوێـك بێـئەوەی هەستی پێ بکەم. وەك دەزانن خەونەکان شتی سەیروسـەمەرەن، هەنـدێکیان بە تەواوی وردەکارییەکـانەوە بـۆت دەردەکەون، وەك

ئەوەی پــارچە زێڕێــك بێــت كە چــۆن بە بەبەر دەســتی زێڕینگەرێك دەردەكەوێت. هەنـدێكی دیـكە لە نێـو كات و شوێن مەلە دەكەن و هـیچ ڕۆشـنییەكی تێـدا نیـیە. ئەوەی دەسـتی لە خەونەكانمان هەیە، ئارەزووە و نەوەك ئەقڵ. دڵە نەوەك سـەر. لەگەڵ ئەوەشـدا زۆرجـار عەقڵـم ڕۆڵێكـی گەورەی لە خەونەكـانم هەیە. چەنــدین سـەیر وسـەمەرە دەردەخـات كە لێكـدانەوەیان ئەستەمە! یەكێك لەوانە من برایەكم هەبوو پێنج ساڵە مـردووە. هەندێكجار دێتە خەونمەوە. لە كارەكانـم بەشدار دەبێت. هەست بە چێژێكـی گەورە دەكەیـن. لە میانەی هەمـوو ئەمـانەوە وەهـا نایەتە خەیاڵم كە براكەم مرد بێت یان نێژرا بێت.

چۆن سەرسـام نەبـم. سـەرەڕای ئەوەی مـردووە لە تەك مـن دانیشتووە و بەشداری كارەكانی من دەبێت؟

بۆچی عەقڵم ڕێگە دەدا ئەم كارە ڕووبـدات و تێـپەڕ بێـت؟ بە هەرحاڵ ئەوەندە بەسیەتی.

ئێستا دێمە سەر ئەو خەونەی بینیومە. بەڵـی ئەو خەونەی كە لەو شەوەدا بینیومە. خەونـی مـن لە شـەوی سـێیەمی مـانگی تشرینی دووەم.

ئەوان گاڵتە بەمن دەکەن و تەنها بەخەونێکی دەزانن، بەڵام ئەوەی من بینیومە خەون بێت یا نا، گرنگ ئەوەیە (هەقیقەت)ی بۆ من دەرخستووە. مادامەکی من هەقیقەتی هەتاهەتاییم بینیوە و ناسیومە، زانیومە جگە لەو هیچ هەقیقەتێکی دیکە نییە، گرنگی چی دەبێت، ئاخۆ ئەمەم لە خەون بینیوە یان زیندەخەو، با خەون بێت. ئەم ژیانەی کە زێدە بایەخی پێدەدەن، من خەریك بوو بە یەك فیشەك کۆتایی پێ بهێنم، بەڵام خەونەکەم، خەونی من، ژیانێکی نوێی نیشان دام، مەزن، نوێ، بەهێز.

گوێ بگرن:

من گوتم خەوتم بەر لەوەی هەستی پێ بکەم، بەڵام هێشتا بابەتەکانم هەرگێڕ و وەرگێڕ دەکرد. بینیم لەهەمان بارودۆخ دابووم، دەمانچەکەم بە دەستەوە بوو، راستەوخۆ لەسەر دڵم دانا بوو- دڵم نەوەك سەرم- من پێشتر پلانم دانا بوو دەمانچەکە بە لاچانگی چەپم بنێم، دەمانچەکەم لەسەر سنگم دانا، خولەکێك یان دووان چاوەڕوان بووم، ئەو کاتە مۆم و مێز و دیوارەکان لەبەرامبەر من دەلەرزینەوە، بەپەلە فیشەکەکەم تەقاند.

هەنـــدێك جــار لە خەونـــدا لە شـــوێنێكی بەرز دەكەویـــتە خـوارەوە. یـان زەبرێكـت بەردەكەوێـت و لێـت دەدرێـت. بەڵام تـۆ زۆربەی كات هەست بەئـازار ناكەیت. تەنها مەگەر خۆت لەسـەر قەرەوێـــڵەكە ئەزیەت دابێـــت. ئەوكـــاتەش لەژێـــر كـــاریگەری هەسـتكردن بەئـازار بێـدار دەبیـتەوە. لە خەونەكەی منـیش هەر ئەمە روویـدا. مـن لە ئەنجـامی تەقەكـردنەكە هەسـتم بە ئـازار نەكرد. بەڵام وا خەیاڵم كرد حەپەسام و هەموو گیـانم دەلەرزی. دواتـر هەسـتم بە ئـارامی كـرد. تـاریكیەكی ئەنگوسـتەچاو دەوری دام. وەك كـوێرو لاڵ بـووم. دواتـر ئەوەتـا مـن لەسەرشـتێكی رەق لەســـەردەم راكشـــاوم. شـــتێك نـــابینم و نـــاتوانم جـــوڵە بـــكەم. خەڵــكەكەی دەوروبەرم هـــاوار و فیغانیـــانە. كـــاپتنیش.... ژنەی خاوەن ماڵیش دەگریت. دواتر سەر لەنـوێ هێمنـی باڵیـان بەسـەر دەكێشێ. ئەوەتائەوان من لە تابوتێكی داخراو هەڵدەگرن. هەست دەكەم تـابوتەكە بەرزونـزم دەبێـتەوە. سـەرەتا بیـر لە بـابەتەكە دەكەمەوە. بیرۆكەیەك یەكەم جارە من تووشی شۆك دەكات. مـن مردووم. تەواو مـردووم. بێگومـان ئەوە دەزانـم. نـاجوڵێم. شـتێك نـابینیم. بەڵام هەســـت دەكەم و بیـــردەكەمەوە. خێـــرا بەپێـــی

لـۆژیکی هەمـــان خەون بـــابەتەکە دەنووســـمەوە. بـێ هـیچ نارەزاییەك بابەتەکە قبوڵ دەکەم

ئەوەتا ئەوان من لە زەوی دەنێژن، دواتریش دەڕۆن و تەنیا دەمێنمەوە. تەواو تەنیا. ناتوانم جوڵە بکەم.

لە رابـردوودا کاتێـك خەیـاڵی ئەوەم دەکـرد چۆن لە گـۆڕدا دەنێـژرێم. هەمیشـه بـابەتی گـۆڕ و هەسـتی تەنیـایی و سـەرمام بەیەکتر دەبەستەوە. بۆیە ئێستا هەست بەسەرمایەکی کوشندە دەکەم. بەتـایبەتیش لەسـەرە پەنجەکـانی پـێم. جگە لەمەش هەست بە هیچ شتێکی دیکە ناکەم.

مـن راکشـابووم. سـەیر ئەوە بـوو چـاوەڕوانی هـیچ شـتێك نەبـووم. لەوە دڵنیـا بـووم. دڵنیابوونێـك کە هـیچ نـاڕەزایی تێـدا نەبێت.دەبێت مردوو چاوەڕوانی هیچ شتێك نەکات. نـازانم چەن کـات تێپەڕیـوە. کاتژمێرێـك. چەنـد رۆژێـك. یـان رۆژانێکـی زۆر تێپەڕیووە.

دواتـر لە ناکـاو دڵـۆپە ئـاوێکی گەورە کەوتەسـەر چـاوە نوقـاوەکەی لای چەپـم. دوای چەنـد خـولەکێکی دیـکە چەنـد دڵۆپێکی دیکە دەهات. بەمشێوەیە لەهەر خولەکێك چەنـد دڵـۆپە ئاوێك دەهاتە خـوارەوە. لە دڵەوە هەستم بە تورەبوونێکی تونـد

کرد، دواتر هەستم بە ئازارێکی فیزیکی کرد: ئەمە زامەکەمە-وا بیرم کردەوە- شوێنی فیشەکەکەیە" دڵۆپە ئاوەکان بە بەردەوام لە هەر خولەکێك دەرژانە سەر چاوە نووقاوەکانم.

لە ناکاو دەمبینەوە کە بە هەموو هەست و سۆزم هاوار دەکەم- بەڵام بە کپی، جوڵەم تێدا نەبوو- دواتر قیژاندم و بانگی ئەو کەسەم دەکرد کە بەسەرم زاڵببوو.

- تۆ هەر کێ بیت، ئەگەر بوونت هەیە، ئەگەر بکرێت ئەوا ئێستا رووەدا بوونی هەبێت، ئەگەر لەپێناو تۆڵەکردنەوە بێت لە بەرامبەر ئەو خۆکوشتنە دەبەنگانەی ئەنجامم داوە، رێگە بە روودانی ئەم کارە مەدە، چونکە شتێکت لەمن دەستناکەوێ تەنها گاڵتەجاڕیی نەبێت. ئەو ئەشکەنجەیەی کە ئێستا دەرهەق بەمن ئەنجام دەدرێت، هەر چەندە بێت هاوشانی هەستکردنم نییە بە رق وکینە. بۆیە بە بێدەنگی هەستی پێدەکەم، ئەگەر بۆ ملیۆن ساڵی داهاتووش بێت.

بەوشەکانم بانگم دەکرد و دواتریش بێدەنگ بووم، خولەکێك بە بێدەنگییەکی قوڵ تێپەڕ بوو. دڵۆپە ئاوێك کەوتە خوارەوە زۆر دڵنیابووم ئەو بابەتە لە ناکاو دەگۆڕێت، ئەوەتا لە ناکاویش گۆڕەکەم کرایەوە. یان با بڵێین من نەمدەزانی ئاخۆ

ئەو گۆڕە کرایەوە، یان سەرەکەی تواپەوە، بەڵام هەستم کرد بوونەوەرێکی نارۆشن و نەناسراو، منی گرت و بە ئاسمانی بەرزکردمەوە، لەناکاو بینایم گەڕایەوە، بەڵام تاریکییەکەی ئەوتۆ هەبوو هەرگیز پێشتر نەمدییوە، پرسیارم لەم بوونەوەرە نەکرد کە منی هەڵگرتبوو، بەڵکو سەنگی خۆم پاراستبوو بێدەنگ بووم، هەستم بە ترس نەدەکرد، بەڵکو بەمە دڵخۆش بووم، ئەوەم بیر نەماوە چەندێك فڕیین، ناشتوانم وێنای ئەوە بکەم: ئەمە روویدا هەروەك چۆن بابەتەکان لە خەونەکان کات و شوێن دەبەزێنن، سەرپێچی هەموو رێساکانی عەقڵ و دنیا دەکەن و شتێکی دیارکراوت تێدا دەستناکەوێ.

ئەوەم لە بیرە لەتاریکیەکە چاوم بە ئەستێرەیەك کەوت، بۆ خواستی خۆم وتم" ئایا ئەمە ئەستێرەی سیرۆسە؟" چونکە حەزم نەدەکرد هیچ پرسیارێك لەوە بکەم کەمنی هەڵگرتبوو، ئەویش وەڵامی دایەوە و وتی" نەخێر، ئەمەیان هەر ئەو ئەستێرەیە کە کاتێك دەگەڕایەوە لە نێو پەڵە هەورەکان بینیت، دەمزانی ئەم بوونەوەرە شێوەی مرۆڤی هەیە، سەیر ئەوە بوو من ئەم بوونەوەرەم خۆشنەویست، بەڵکو لەبەرامبەری هەستم بەرق وکینەیەکی زۆر دەکرد.من چاوەڕوانی عەدەمییەتی رەها

بووم، هەر لەم پێناوەشدا تەقەم لە دڵم کرد، کەچی کەوتومەتە دەستی بـوونەوەرێکەوە، بێگومـان ئەو بـوونەوەرە مـرۆڤ نیـیە، بەڵام (بوون)ی هەیە.

بیرم لە....خەونە سەیرەکە دەکـردەوە" کەواتە لە دوای گۆڕ ژیـانێکی دیـکە هەیە" بەڵام خەسـڵەتی سـەرەکییم هێشـتا لە ناخمدا مابوو" کەواتە ئەگەر دەبێت جارێکی دیکە هەبـم- بیرم کـردەوە- بە ویسـتی کەسـێکی دیـکە ئەوا دەبێـت ژێردەسـتە و ریسوا نەبم"

" تۆ دەزانی من لە تۆ دەترسم، لەبەر ئەوەش رقت لە مـنە" ئەمەم بە هـاوڕێیەکەم وت، بێـئەوەی بتـوانم ئەم پرسیارە قـوت بـدەمەوە کە مـایەی ریسـوابوونی مـن بـوو، ئەم پرسـیارەش وەك دانپێـنانێك بوو، وەك دەرزیـیەك بـوو بەهۆی ترسنۆکییم لەدڵم دەچەقی.

وەڵامـی پرسـیارەکەمی نەدایەوە، بەڵام لەناکـاو هەسـتم کـرد ئەو رقی لەمـن نـابێتەوە، بە کـردەی منـیش پێنـاکەنێ، تەنـانەت لاوانەوەشم بۆ ناکات، بەڵکو ئەو رێگـایەم بە ئامانجێـك کۆتـایی دێـت، نهێنـی و نەزانـراوە، تەنهـاش پەیوەنـدی بەمـنەوە هەیە.

ترس لە دڵم زیاد بوو، بێدەنگی هاوڕێیەکەم بۆ من قوڵ و ئازاربەخش بوو.

بە چەندین ئاسمانی تاریك تێپەڕین چاو نەبینیوە، ئەستێرەکان وەك پێشتر ئاسایی نەبوون. پێشتر دەمزانی لە قوڵایی ئاسمانەکانەوە ئەستێرەی وەها هەیە، ڕووناکییان بە هەزاران یان ملیۆنان ساڵ ناگات بە ئێمە. لەوانەیە هەموو ئاسمانەمان تێپەڕاندبێ. لە تەنیایی قوڵی دڵە ترساوەکەم چاوەڕوانی شتێکم دەکرد. لەناکاو سۆزێکی ناسراو هەموو گیانی لەرزاندم، بەهێزەوە رابردووی لەمن دا زیندوو کردەوە: ئەوەتا لە ناکاو خۆرەکەی خۆمانم بینی!

دەزانم ناکرێت ئەمە خۆری خۆمان بێت، خۆرەکەمان ئەوەی زەوی لێ پەیدا بووە. هەروەها بە دوورییەکی بێ کۆتایی لە خۆرەکەمان دوورین، بەڵام بە هەموو هەستەکەمان، هەستت بەوەدەکرد ئەمە تەواو لە خۆرەکەی ئێمە دەچێ، کۆپییەکە لەخۆرەکەی خۆمان هاوشێوەیەتی. هەستێکی خۆش و شیرین هەموو گیانمی نقوم کرد: هێزی داهێنەرانەی ئەو ڕووناکییەکەی منی تێدا لە دایك بووە، گەڕایەوە دڵم و سەر لەنوێ زیندوو

بوومەوە. هەستم بەوە کرد لەوەتەی لە گۆڕ نراوم. ژیان دووبارە دەگەڕێتەوە ناو دەمارەکانم.

- بەڵام ئەگەر ئەمەیـان رۆژ بێـت. تەواو رۆژەکەی ئـێمە بێت- بە خۆشحاڵییەوە وتم- ئەی کەواتە کوا زەوی؟

یـاوەرەکەم ئاماژەی بـۆ ئەستێرەیەك کـرد کە تـارییەکی بە رووناکییەکی شـین بـاو لـێ دەدرەوشـایەوە. هەر ئێستاش ئـێمە بەرەو ئەو ئەستێرەیە دەڕۆیشتین.

- ئایا دەکرێت نموونەی ئەم دووبارەبوونەوەیە لە گەردوون رووبـدات؟ ئایـا ئەمەیە یاسـای سروشـت؟ ئەگەر ئەمەیـان زەوی بێت. ئایا وەك تەواو وەك زەوییەکەی ئێمەیە. وەك ئەو نەگبەت و هەژارە. وەك ئەو گرانبەهـاو بـۆ ئەبەد خۆشەویسـتە. وەك ئەو توانـای هەیە خۆشەویسـتی رۆڵەکـانی بەدەسـت بهێنـێ. تەنـانەت ئەوانەی نکۆڵیشی لێ دەکەن؟ من ئەو قسـەیەم بە خۆشـحاڵییەوە دەکـرد- لە ئەنجـامی خۆشەویسـتیەکی تونـد و زاڵ لەبەرامـبەر ئەو زەویـیەی کە تێیـدا لە دایـك بـووم و جێمێشـت. دەلەرزیـیم. تارمـایی ئەو کیـژۆڵە بەدبەخـتەش لەبەر چـاوم دەردەکەوت کە سووکایەتیم پێکرد.

- هەمـوو شـتێك دەبینـی- یـاوەرەكەم وەڵامـی دایەوە و وشەكانی بۆنی خەمێكی لێ دەهات.

بە خێرایـی لە هەسـارەكە نزیـك دەبووینەوە. لە بەر چاوم قەبـارەی هەسـارەكە گەورە دەبـوو. دواتـریش زەریـا و سـنووری ئەوروپـا دەركەوت. ئیرەییەكـی سـەیرو پیـرۆز لە دڵـم داگیرسـا" چـۆن دەكرێـت ئەم دووبـارەبوونەوەیە روو بـدات؟ بـۆ چ مەبەسـتێك روو دەدات؟ مـن خۆشـمدەوێ... مـن دەتـوانم ئەم زەوییەم خۆشبوێ كە بەدوای خـۆم جێمهێشتن ئەو زەوییەی كە خوێنی منی بەسـەر پـڕژا. ئەمەش ئەو كـاتە بـوو كە گوللەیەكم لە دڵم دا و هەموو شتێكم رەتكردەوە و كۆتاییم بە ژیانم هێنـا. بەڵام لەوە نەوەسـتام بـۆ هەتاهەتـایە خۆشـمبوێ, تەنـانەت ئەو شەوەی كە جێمهێشت. لە ئەنجامی خۆشەویستیەكەی لەهەموو كاتێك زیاتر هەستم بە ئازارێك دەكرد. ئایا لە سەر ئەم زەوییە نـوێیەش ئازارێـك هەیە؟ لەسـەر زەوییـەكەی خۆمـان نـاتوانین خۆشەویستی بكەیـن. تەنها لەگەڵ ئـازار و پەژارە نەبێت. تەنها لەرێگـای ئەم دووانەوە نەبێـت. تەنهـا بەمـانە دەتـوانین خۆشەویستی بكەیـن. تەنـانەت خۆشەویستیەكی دیـكە نـازانین. بۆیە من داوای ئازار دەكەم بۆ ئەوەی بتوانم خۆشەویستی بـكەم.

چەنــدە تێنــوم بــۆ ئەو کــاتەی تــا زەوی مــاچ بــکەم و بە فرمێســکەکانم بیشــۆم. ئەمە ئەو زەویــیە کە جێمهێشــت و نامەوێ، کەچی ناشتوانیم لە شوێنێك بژیم لەوێ نەبێت.

بەڵام یـاوەرەکەم منـی تەنیـا جێهێشـت. لەناکـاو- بێـئەوەی ئاگادار بم- لەسەر زەوییەك وەستام پڕ بوو لە رووناکی خۆر، رۆژێکــی نایــاب و خــۆش بــوو. وا بــزانم لە ســەر یەکێــك لە دوورگەکــانی گریــك بــووم، یــاخود لە ســەر کەنارێــك ســەر ئەو کــۆمەڵە دوورگەیە بــووم، تەواو وەك ئەو زەویــیە بــوو کە ئــێمە هۆگری بووین.

شــادییەکم لە هەمــوو شــوێنێکەوە بە دیکــرد، ئەو شــادییە دەگەیشــتە حــاڵەتی سەرمەســتی. دەریــایەکی شــین و جــوان، بە خۆشەویستیەکی رۆشن دەستلەملانێی شەپۆلەکانی دەبوو.

چەنــدین درەختـــی بەرز و نایـــاب لە شـــوێنەکە بەرز دەبـــوونەوە، چڕوپـــڕ لە گەڵا، وەك ئەوە بـــوو خشـــپەی گەڵا ناســکەکەکانی ســڵاوم لــێ بــکەن و بە وشــەکانی ئەڤینــداری بمدوێنن. بۆنی گوڵ و چیمەنەکان دەهات، کەچی چۆلەکەکــانیش پــۆل پــۆل دەفــڕین و بە ئاســوودەیی لەســەر شــان و دەســتم دەنیشتنەوە و بە باڵەکانیان چەپڵەیان لێدەدا و چریوەیــان دەدا.

دواجاریش خەڵکی ئەم زەوییەم ناسی، کە خۆیان هاتنە لام و دەوریان دام و ماچیان کردم.

لە سیمایان دانایی و هۆشیاریی بەدی دەکرا. تا ئاستی هێمنی و سەنگینی. لە دەنگیان و وشەکانیان ئاوازی کامەرانی و خۆشگوزەرانی دەبیسترا. لە یەکەم تێڕوانینم بۆ سیمایان لەهەموو شتێك گەیشتم. ئەمە ئەو زەوییە کە هیچ خراپەکاریی تێدا نەکراوە، خەڵکی بێ خراپەکاریی لەسەری دەژین. ئەوان لەو بەهەشتە دەژین کە باب و باپیرانمان بەر لەوەی خراپەیەك ئەنجام بدەن تێیدا ژیاون. تەنها جیاوازییەك هەیە ئەویش ئەوەیە ئێرە زەوییە. کە لەهەموو لایەکەوە بەهەشتە. هەموو ئەو خەڵکەی دەوروبەرم بە خۆشحاڵی و بەشادییەوە پێدەکەنن، لە من نزیك دەبنەوە و گاڵتەوگەپم لەگەڵ دەکەن. دواتر منیان لەگەڵ خۆیان بردەوەماڵەکانیان، هەوڵیان دەدا سەرگەرم و خۆشحاڵم بکەن. پرسیاریان لە هیچ شتێك نەکرد، وەك ئەوە بوو هەموو شتێك بزانن، وام بۆ دەرکەوت. ئەرکیان ئەوە بوو گوزارشت و هێمای ئازار و پەژارە لە سیمای من دووربخەنەوە.

ئێوە جارێکی دیکە دەیبینن: با ئەوەی من بینیومە تەنها خەونێك بێت! بەڵام هەستی خۆشەویستی ئەوخەڵکە نایاب و

بێگوناهانە، بۆ هەتاهەتایە لە دڵم جێگیر بوو. هێشتا هەست بەوە دەکەم خۆشەویستی ئەوان بۆ من هەڵدەقوڵی وەك ئەوەی بوونیان هەبێت. من خۆم ئەوانم بینی و ئەوانم ناسی و دواتریش لە پێناو ئەوان ئازارم چەشت. ئاخ ئەو کات درکم بەوە کرد من بە تەواوی لەوان ناگەم. بۆم دەرکەوت- منێکی رووسی پێشکەوتخواز، بۆگەنێکی پترۆسبۆرگی- بەشێوەیەکی ئاڵۆز بۆم دەرکەوت ئەوان سەرەڕای زانیارییە فراوانەکانیان، ئاگاداری زاستەکانی ئێمە نیین. دواتریش زوو درکم بەوە کرد زانیاری ئەوان بەشێوەیەکی جیاواز لەوەی لە سەر زەوییەکەی ئێمە هەیە، پێگەیشتووە. تێڕوانینی ئەوانیش تەواو لە تێڕوانینی ئێمە جیاوازە. هێمن و بێ ئارەزوو بوون، هەوڵیان بۆ ناسینی ژیان نەبوو، وەك ئەوەی ئێمە هەمانە، چونکە ژیانی ئەوان تەواوببوو. زانست وزانیاری ئەوان زۆر لە هی ئێمە قوڵتر و بەرزتر بوو. زانستی ئێمە هەوڵ و ناساندنی ژیان و شرۆڤەکردنی دەدات، بۆ ئەوەی ئەوانی دیکە فێر بن، کەچی ئەوان دەیانزانی چۆن دەژین بێ هیچ زانستێك. ئەمەم بەخۆم بینی، بەڵام نەمتوانی لە زانیاریەکانی ئەوان بگەم.

دار و درەختـی خۆیـان نیشـاندام، بەڵام نەمتوانی لە ئاسـتی ئەو خۆشەویسـتیە بەرزە بـکەم، کە بەهـۆی ئەوەوە لە درەختەکانیـان دەڕوانـی. بەشـێوەیەك قسـەیان لەگەڵ درەختەکان دەکـرد وەك ئەوەی قسـە لەگەڵ مرۆڤەکـانی هاوشـێوەی خۆیـان بکەن. هەڵە نییم ئەگەر بڵێم ئەوان زمانی درەختەکانیان دەزانی و بەو زمـانە دەدوان، بەڵـێ زمـانی درەختیـان دۆزیـوەتەوە. درەختەکانیش لە گفتوگۆی ئەوان دەگەیشتن. ئەوان بەم وێنەیە سەیری سروشتیان دەکرد، سەیری گیانلەبەرەکانیان دەکرد کە بە ئاشـتی لەگەڵ ئەوان دەژیـان، نە ئەوان هێرشـیان دەکـردە سـەر ئاژەڵەکانیـان و نە ئاژەڵەکانیـانیش هێرشـیان دەکـرد، بەڵکـو خۆشـیان دەویسـتن و بەخۆشەویسـتی ماڵیـان کردبـوون. ئەسـتێرەکانیان نیشـان دام، بە جۆرێـك قسـەیان لەسـەر ئەستێرەکان دەکرد مـن تێنەدەگەیشتم، بەڵام دڵنیا بووم لەوەی کە ئەوان پەیوەندییەکی زیندوویان لەگەڵ ئەم ئەستێرانە هەیە. تەنهـا پەیوەنـدی و پەیوەسـتبوونی هـزری نیـیە. ئـاخ ئەوان هەوڵیـان نەدا مـن لەوان بـگەم، بەڵکو تەنهـا منیـان خۆشویست. لەبەرامبەریشـدا هەسـتم دەکـرد هەنـدێکجار نەیانـدەتوانی لـێم حـاڵی بـن. لەوانەیە لەبەر ئەوە بێـت مـن قسـەم لەسـەر

زەوییەکەی خۆمان نەکرد، بەڵام ئەو زەوییەم ماچ کرد کە لەسەری وەستابوون، بێ هیچ وشەیەك ڕێزگرتن و خۆشەویستی کرد بۆ ئەوان. ئەوانیش وازیان لەوە هێنا من ئەوانم خۆشبوێ، بێئەوەی لەدڵەوە هەست بە شەرمەزاربوونێك بکەن، چونکە ئەوان تەژیبوون لە خۆشەویستی و ئەڤین.

هەندێکجار کە پێی ئەوانم ماچ دەکرد، فرمێسك بەچاوەکانم دەهاتە خوارەوە، لە پێناو من ئازاریان نەدەچەشت، بەڵام هەستم بە کامەرانی دەکرد، ئەمەش لە بڕی هێزی ئەو خۆشەویستە سەرچاوەی گرتبووە کە قەرەبووم دەکەنەوە. هەندێکجار بەسەرسامییەوە پرسیارم دەکرد: چۆن دەتوانن تەواوی ئەم ماوەیە خراپەیەك دەرهەق بەکەسێکی وەك من نەکەن، ئایا بۆ جارێکیش بێت هەست بە ئیرەیی ناکەن؟ چەندین جار لە خۆم پرسیەوە، چۆن کەسێکی وەك منی لەخۆبایی و درۆزن، توانیومە قسە لەسەر زانست و زانیاریی خۆم نەکەم . کە ئەوان هیچی لێ نازانن؟ چۆن ئارەزووی ئەوەم نەبووە سەرسامیان بکەم، تەنانەت ئەگەر لەپێناو خۆشەویستی ئەوانیش بێت؟ وەك منداڵ دڵخۆش و بەکەیف بوون. بە دارستان و پێدەشتەکانیان دەخولانەوە، گۆرانی نایابیان دەچڕێ. تەنها بە

بەروبوومی درەختەکان و هەنگوینی دارستان و شیری ئاژەڵە خۆشەویستەکانیان دەژیان، ئەوەیش بۆ شتێکی سوکەڵە لە پێناوی خواردن و جلوبەرگیان، کاریان نەدەکرد کەمێك نەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا بەخۆشەویستی دەژیان و منداڵیان دەبوو. من رۆژێك لە رۆژان تێبینیم نەکرد هەڵپەیان بۆ چێژێکی دڵڕەقانە هەبێت، کە هەر کەسێکی سەر زەوییەکەی ئێمە هەوڵی بۆ دەدات و بە سەرچاوەیەکی هەموو گوناه و خراپەکارییەکانی مرۆڤایەتی دەزانرێت.

وەك ئەوەی هاوبەشی نوێیان لە کاروانی ژیان بۆ پەیدا دەبێت، بە لەدایکبوونی منداڵەکانیان دڵخۆش دەبوون. لە نێو ئەواندا ئیرەیی و رکابەرییم نەبینی. تەنانەت مانای ئەو دوو وشەیان نەدەزانی. منداڵی کەسێك منداڵی هەمووان بوو. بەمەش یەك خێزانیان دروست کردبوو. نەخۆشی بەرێژەیەکی کەم نەبێت، نەبوو، بەڵام هەڵبەتە مردن هەبوو، پیرەکانی ئەوان بەهێمنی دەمردن و وەك ئەوەی بخەون و کەسوکارەکانیشیان زەردەخەنەیان لەسەر لێوان بوو، پیرۆزباییان لێ دەکرد. لەسەر لێوەکانیان نیشانەی شادی هەبوو. لەم ماوەیەدا پرسە و فرمێسکم نەبینی، بەڵکو خۆشەویستی نشونمای دەکرد تا

دەگەیشتە حاڵەتی شادیی و خۆشیەکی هێمن و سەنگین و تەواو. ئەمەش وا دەکات بیر لەوە بکەیتەوە، ئەوانە دوای دابڕانی مردووەکانیش پەیوەندی راستەوخۆیان دەمێنێتەوە، تەنانەت مردن ناتوانێ یەکێتی ئەو زەوییە لەنێوان ئەوان جیا بکاتەوە. کاتێك پرسیارم لە بارەی ژیانی ئەبەدییەت دەکرد ئەوان بەتەواوی لەمن نەدەگەیشتن، بەڵام وا دەردەکەویت ئەوان باوەڕیان پێی هەیە بۆ ئەوەی هەست بکەن، ئەمەش پێویستی بەپرسیارکردن نەدەکرد.

پەرستگا لەلای ئەوان نەبوو، بەڵام لە یەکێتیەکی تەواو دابوون، بەردەوام پەیوەندیان بە گەردوونی هەمووەکی هەبوو، ئاینێکی دیارکراویان نەبوو، بەڵکو متمانەیەکی چەسپاویان هەبوو، بەوەی لەژیاندا بۆ ئەندازە بەشادی زەویەکەیان دەگەن، هەموویان مردوو یان زیندوو تا بەرزترین ئاستی پەیوەندی و یەکێتی دەڕۆن لەگەڵ گەردووندا. ئەوان بەخۆشی و بێ پەلەکردن چاوەڕوانی ئەوساتە بوون، بێ ئازاری چاوەڕوانی، وەك ئەوەی بە ترپەی دڵنیان هەستیان بەو ساتە کردبێت و لە نێوان خۆیان دەستاو دەستیان پێ کردبێت.

بەر لەوەی بخەون، حەزیان دەکرد تیپێکی مۆسیقای ڕێکوپێك پێك بهێنن. ئەو گۆرانیانەیان دووبارە دەکردەوە.کە ئەو هەست و سۆزەی تێدا بەدیدەکرا کە لە ڕۆژدا لە دەروونیان کەڵەکە بوو، بەمەش ڕۆژەکەیان پیرۆز دەکردو ماڵئاواییان لێ دەکرد، سروشت و زەوی و دەریاو دارستانیان پیرۆز دەکرد. هەموویان حەزیان لە دانانی گۆرانی بوو، یەکێکیان ستایشی ئەویتری دەکرد، لەنێوان خۆیان وەك منداڵ ستایشی یەکتریان دەکرد. ئەو گۆرانیانە سادەبوون بەڵام کاریگەر بوون، چونکە لە دڵەوە هەڵدەقوڵان. تەنها ئەوە نەبوو بەگۆرانی دڵی یەکتر خۆش بکەن، بەڵکو گۆرانیان بۆ هەموو شێوەکانی ژیان دەچڕی، ژیانیان بە خۆشەویستی یەکتر بەسەر دەبرد.

من بەتەواوی لە گۆرانییەکانی سەرمەستی و سەرکەوتن نەدەگەیشتم کە ئەوان دەیانچڕی. هەرچەندە من مانای وشەی گۆرانییەکانم دەزانی، لەگەڵ ئەوەشدا نەمدەتوانی بگەمە قوڵایی تەواوی واتاکان، چونکە عەقڵم پێی نەدەگەیشت. کەچی لەبەرامبەردا دڵم دەیتوانی لەو واتایانە بگات و زیاتر و زیاتر لێیان تێر ببێت. چەندین جار پێم گوت، دەمێکیشە درکم پێکردەوە. ئەو شادی و کامەرانییە وا دەکات هەستی غەریبیم بۆ

زەوییەکەمـان هەبێـت، تەنـانەت هەسـتێك هەنـدێکجار دەگـاتە ئاستی ئازارێك بەرگەی ناگرم. من لە خەونی منداڵیم، هیواکانی عەقڵم پێشتر وێنەی سەرکەوتنی ئەوانم کردووە. مـن کاتێـك لەسـەر زەوی بـووم نەمـدەتوانی سـەیری خۆرئـاوابوون بـکەم چاوەکـانم پـڕ دەبـوون لە فرمێسـك... رقـم بـۆ خەڵکـی زەوی هەمیشە تێکەڵبووە بە ئازار: بۆچی نەمدەتوانی رقم لێیان بێت، یان ئەوانم خۆش بووێ؟ بۆچی نەمـدەتوانی لەگەڵیان لێبوردە بم؟ بۆچی خۆشەویستی مـن بۆ ئەوان تـێکەڵ بە ئـازار دەبێـت؟ بۆچی نەمدەتوانی رقم لێیان بێت، یان ئەوانم خۆشبوێت؟

ئەوان گوێیـان لەمـن دەگـرت، دەمزانـی نـاتوانن وێنـای قسـەکانی مـن بـکەن، لەگەڵ ئەوەشـدا لەو قسانەی بـۆ ئەوانـم دەکـرد پەشـیمان نیـیم، چـونکە ئەوان لەو غەریبـیەی مـن دەگەیشتن کە بۆ ئەو کەسانە هەمبوو کە لێیان دابڕاوم.

بەڵـێ، کاتێـك بە نیگـای خۆشەویستیەکی بـێگەرد سـەیری منیـان دەکـرد، هەسـتم دەکـرد دڵـم لە حـزوری ئەوان، وەك دڵـی ئەوان، پـاك و راستگۆ دەبێـت، ئەوکـاتەش هەسـتم بە پەشـیمانی نەدەکـرد لەوەی تێیـان نەگەیشـتووم. لە ژێـر کـاریگەری

هەستکردن بە تەژیبوون لە ژیان لەنێو ئەواندا، هەناسەبڕکی دەبووم و بە بێدەنگی بۆ ئەوان نوێژم دەخوێند.

(.....) ئایا دەزانن، من بۆ ئێوە نهێنیەك دەدرکێنم، لەوانەیە ئەوەی پێشتر گێڕامەوە خەون نەبێت! چونکە ئەوەی روویدا لە هەقیقەتدا تۆقینەر و ترسناك بوو، بەشێوەیەك ناتوانرێت لەخەون بەدی بکرێت.

با گریمانەی ئەوە بکەین، ئەم خەونەم زادەی دڵم بووە، ئایا لە دڵم بە تەنیا لە توانای هەیە، ئەو هەقیقەتە بێشوومارە بهێنێتە کایەوە کە دواتر بەدی هاتووە؟ چۆن دەکرێت من بە تەنیا خەیاڵی هەموو ئەوانە بکەم، یان لەدڵەوە خەونی پێوە ببینم؟ ئایا دڵە بچووکەکەم و ئەو عەقڵ وشك و ناجێگیرەم دەتوانن بەو ئاستە بەرزە بگەن، ئەو هەقیقەتە بناسن. خۆتان بڕیار لەسەر ئەوە بدەن: من تا ئێستا زۆر شتم لە ئێوە شاردۆتەوە، بەڵام ئێستا راستییەکەتان پێ دەڵێم.

هەموو بابەتەکە ئەوەیە.... هەمووانم تێکدا.

بەڵێ، بەڵێ. بابەتەکە بەوە کۆتایی هات هەموویانم تووشی بەدکاریی کرد! چۆن ئەوە روویدا- نازانم!

بە تەواوی بیرم نییە، ئایا ئەو خەونم لەسەرووی هەزاران ساڵە تێپەربوو، هەستێکی تەواوی لەدڵم جێهێشت. ئەوەی دەیزانم من هۆکاری گوناهی یەکەم بووم، وەك کرمی بەراز، وەك

گەردیلەیەك پەتا، كە دەتوانی ولاتێك تەواو تێك بدات. بە ئامادەبوونی منیش خاكی كامەرانی كە هیچ گوناهێكی تێدا نەبوو، نەخۆشم خست.

ئەوان فێری درۆ بوون. حەزیان لێكرد و لایەنە جوانەكانی درۆیان ناسی. لەوانەیە سەرەتا بابەتەكە بێ مەبەست و تەنها بۆ گاڵتەوگەپكردن بێت. یان بۆ ناز و گاڵتە ویاریی بێت. كەچی لەراستیدا سەرەتاكە وەك گەردیلەیەك بوو. ناوكی درۆ چووە دڵیانەوە و بەدڵیان بوو. دواتریش بە خێرایی چێژ دەركەوت. لەدوای چێژیش ئیرەیی. ئیرەیش لەلایەن خۆیەوە دڵرەقی لێ پەیدا بوو... ئاخ.. نازانم، لەبیرم نییە. بەڵام دوای ماوەیەكی كەم خوێنی یەكەم رژا: سەرسام و حەپەسان، جیابوونەوە و لەیەكتر دووركەوتنەوە. دواتر هاوپەیمانی دەركەوت. یەكێك لەدژی یەكێكی دیكە. دەستیان كرد بە گلەیی وسەرزەنشتكردنی یەكتر.دواتر شەرمیان ناسی، ئەویش بووە بەشێك لە چاكەخوازیی. دواتر چەمكی شەرەف دەركەوت. هەر هاوپەیمانیەك ئاڵای تایبەتی خۆی بەرزكردەوە. دەستیان بەوە كرد ئازاری ئاژەڵان بدەن. ئەوانیش بەرەو دارستانەكان رایانكرد و بوون بە دوژمنی مرۆڤەكان. دواتر جەنگ لە پێناو جیابوونەوە و تاكگەرایی و كەسێتی هەڵگیرسا. لەپێناو ئەمە بۆ

من و ئەمە بۆ تۆ. دەستیانکرد بەوەی چەندین زمانی جیاواز قسەیان دەکرد. دڵتەنگییان ناسی و حەزیان لێکرد.

تینوی ئازار بوون، وتیان تەنها بە ئازار بە هەقیقەت دەگەیت. ئەو کاتەش زانست لەنێوانیان دەرکەوت. کاتێک شەرانگێز بوون دەستیانکرد بەوەی قسە لەسەر برایەتی و مرۆڤایەتی بکەن، ئینجا لەو بیرۆکانە تێدەگەیشتن. کاتێک بوونە تاوانبار پێشنیازی دادپەروەرییانکرد، یاسایان دانا بۆ ئەوەی دادپەروەریی بەرقەراربکات، لە پێناو یاسا ئامێری سەرپەڕاندنیان دانا. تەنها کەمێک بیریان بوو چیان لەدەستداوە. ڕەتیان کردەوە باوەڕ بەوە بکەن ڕۆژگارێک هەبوو بێگوناه و کامەران بوون. گاڵتەیان بەوە کرد نموونەی کامەرانییە دێرینەکەیان ئەگەری بەدیهاتنی هەبێت و بەخەونیان ناوبرد. بێ توانا بوون لەوەی بەشێوەیەکی بەرجەستە کراو وێنای ئەو ژیانە کۆنەیان بکەن. لە بابەتە سەیرەکان ئەوەبوو: ئەوان سەرەڕای ئەوەی باوەڕیان بە کامەرانی کۆن لەدەستدابوو، بە ئەفسانە و هەقایەت ناویان دەبرد. کەچی بەهێزەوە دەیانویست بەرائەت و کامەرانیان بگێڕنەوە، دووبارە وەك منداڵ لەبەرامبەر ئاواتەکانیان کڕنۆشیان برد. ئەو ئاواتانەیان پیرۆز کرد و پەرستگایان بۆ

دروستکرد، تا لەوێ بۆ ئەو بیرۆکانە نوێژ بکەن، لەگەڵ ئەوەشدا دەزانن ئەو بیرۆکانە نایەتەدی.

بەڵام فرمێسك هەمیشە یاوەری نوێژ و کڕنۆشیان بوو. سەرەڕای ئەمەش ئەگەر توانای گەڕانەوەیان هەبێت بۆ سەردەمی ئەو بەڕائەت و کامەرانییەی لەدەستیان داوە، ئەگەر یەکێك بێت ئەم حاڵەتەیان لەبەردەم دابنێ و لێیان بپرسێ: ئارەزووی گەڕانەوە بۆ لای ؟. مەزندە دەکرێت ڕەتی بکەنەوە و بڵێن: با ئێمە درۆزن، شەڕانگێز، نادادپەروەر بین، ئێمە ئەوە دەزانین، بەهۆی ئەمەوە دەگرین و ئازار دەکێشین. بە توندترین شێوە سزای خۆمان دەدەین، زیاتر لەوەی کە دادپەروەرێکی بەخشندە سزامان بدات، کە هێشتا نازانین ناوی چییە.

بەڵام ئێستا زانستمان هەیە، بەهۆی زانستەوە سەر لەنوێ لە هەقیقەت دەگەڕێین، ئەمجارە بە هۆشیاریەکەوە لە هەقیقەت دەگەین، کەلەسەرووی هەستەکانەوەبێت. بەهۆشیاریی لەژیانێك دەگەین تەنانەت لەسەرووی خودی ژیانەوە بێت. زانست داناییمان پێ دەبەخشێ، دانایش یاساکان، ناسینی یاساکانی کامەرانیش لەسەرووی کامەرانییەوەیە.

ئەمانەیان گوت، دوای ئەم وشانە ئاستی نەرجسیەت و خودپەرستی هەر یەکەیان بەسەر ئەوانی دیکە بەرزبۆوە. نەیاندەتوانی جگە لەمە ڕەفتار بکەن. ئیرەیی هەریەکەیان زیاد

بوو. بۆیە هەوڵی دەدا کەسانی دیکە ریسوا بکات و ئاستیان کەم بکاتەوە. تەنها پشتی بەمانەوەی خۆی دەبەست. لێرەشەوە کۆیلایەتی دەرکەوت. تەنانەت کۆیلایەتی خۆویستانە دەرکەوت: لاوازەکان خۆویستانە ملکەچی بەهێزەکان بوون. چاویان بڕیبووە ئەوەی ئەو بەهێزانە هاوکاریان بکەن. لە تێکشکاندنی کەسانی لاوازتر لەخۆیان. خەڵکانێکی چاکەکار دەرکەوتن. ئەوان فرمێسك لەچاوان و ئامۆژگارییکار. ئەو چاکەکارانە قسەیان لەسەر فیزی ئەوان کرد.باسی ئەوەیان کرد کە هاوسەنگی و دادپەروەرییان لەدەستداوە. شەرمیان نەماوە. کەچی ئەوان گاڵتەیان بەچاکەکاران کرد و هەندێك جاریش بەردبارانیان کرد. لێرەوە خوێن لە بەردەم پەرستگاکان رژا. لەبەرامبەریش کەسانێك دەرکەوتن بیریان دەکردەوە: چۆن یەکێتی بگەڕێنەوە ناو خەڵك بەشێوەیەك هەر کەسێك خۆی لەهەموو کەسێك خۆشتر بوێت. بەڵام رێگر نەبێت لە رێگای کەسانی دیکەوە. هەمووان بەیەکەوە لە کۆمەڵگایەکی تەبا بژین.

چەندین جەنگ بەهۆی ئەم بیرۆکەیەوە هەڵگیرسا. هەموو جەنگاوەرەکان بەتوندی باوەڕیان بەوە هەبوو گوایە زانست و دانایی و ئارەزووی لە مانەوە. دواجار مرۆڤ ناچاردەکات لەسەر کۆمەڵگایەکی هۆشمەند و تەبا کۆك بێت. هەر بۆ ئەم مەبەستەش داناکان بە پەلە کۆششیان کرد. هەموو نادناکان

لەناوبەرن، کە لەبیرۆکەی ئەوان ناگەن، تا نەبن بە لەمپەڕ لەڕێگای سەرکەوتنی ئەوان.

ئارەزووی مانەوەی خودی، هەر زوو لاواز بوو. لەشوێنی ئەوە ئەوانەی شانازیی بەخۆیانەوە دەکەن و لەپشت ئارەزووەکانیانەوە هەنگاو دەنێن، ئەوانەی داوای هەموو شتێک دەکەن و هیچ شتێکیان ناوێ، لەپێناو هەموو شتێک پەنایان بردە بەر وەحشیگەرایی، ئەگەریش بە ئامانجی خۆیان نەگەیشتن، ئەوا پەنایان بۆ خۆکوشتن دەبرد!

چەندین ئایین دەرکەوت، کە بانگەشەیان بۆ (عەدەمییەت) و تێکشکاندنی خود دەکرد. ئەمەش لە پێناو ئاسوودەیەکی ئەبەدی لە (نەبوون).

دواجار ئەم مرۆڤانە لەکارە بێهوودەکانیان ماندوو بوون، لە سیمایان نیشانەی مەینەتی دەرکەوت، بۆیە بانگەشەیان بۆ ئەوە دەکرد، گوایە ئازار ومەینەتی بریتین لە جوانی، چونکە هزر بریتیە لە ئازار. لەسەر ئەوەش لە گۆرانییەکانیان ستایشی ئازاریان دەکرد. دەستەکانم شۆڕبۆتەوە و بەنێویان دەگەڕێم: لە پێناویان دەگریم، زیاتر لە جاران خۆشمدەوێن، ئەو کاتەی ئازار بەسیمایانەوە نەبوو، بێگوناە و نایاب بوون، ئەو زەوییەی پیسیان کردووە، زیاتر لە جاران خۆشم دەوێ. رۆژانێک بەهەشت بوو، لەبەر ئەوەی ئازار لەسەر رووی دەرکەوت، ئاخ بەداخەوە.

هەمیشــە حەزم لە ئــازار و پەژارە بــووە. بۆخــۆم ئەو دووانەم خۆشویستووە، چ کەی لەپێناو ئەوان گریام و کەوتمە لاواندنەوە.

دەستم بۆ ئەوان درێژ دەکرد و نەفرەتم لەخۆم دەکرد. تـا ئاسـتی هـورێنەکردن رقـم لەخـۆم دەبـۆوە. پێمگـوتن هەمـوو ئەمانە من دروستم کردن، من بەتەنیا. مـن خراپەکارییم هێنـا، ناتەبایی و درۆ. لێیان پاڕامەوە بۆ ئەوەی لەخـاچم بـدەن، فێـرم کردن چۆن خاچ دروسـت بـکەن. ئەو بـڕە هێـزەم نەبوو تـا خـۆم بکوژم، بەڵام ویستم هەموو ئازارەکانی ئەوان هەڵبگرم، بـۆ ئـازار و پەژارە گڕم دەگرت، هیوای ئەوەم دەخواست لەو پێناوە دوایـین دڵۆپە خـوێنم ببەخشـم، کەچی ئەوان زیـاتر گاڵتەیـان پـێکـردم ولە کۆتاییدا منیان بەشێت دەزانی. دانیان بەوە نا. ئەوان تەنها ئەوەی خواســتویانە بەدەســتیان هێنــاوە، ئێســتا ئەوەی هەیە، ئەوەی ئەگەری بوونی هەیە، دەبێت هەبێت. دواجار رایانگەیانـد گوایە من مەترسیم بەسەر ئەوانەوە، بۆیە ئەگەر بێدەنگ نەبـم لە نێو شێتان زینـدانییم دەکەن. ئەو کـاتە خەم بەتونـدی سەرم زاڵبـوو، هەسـتمکرد دڵـم بەهێـزەوە دەگوشـرێ، مـن دەمـرم... لەم کاتەدا لەخەو بێدار بوومەوە.

کات دەمەوبەیان بوو، هیچ رووناکی دەرنەکەوتووە، کـاتژمێر نزیک شەشە، دەمبینن هێشتا لەسەر هەمان کورسی دانیشتووم، مـۆمەکەش تـا کۆتـایی سـووتاوە. لەژوورەکەی کـاپتن هەمـوو

خەوتوون، هێمنی بەشێوەیەك بەرقەرارە كە پێشتر لەماڵەكەدا نەبووە.

یەكەم كار ئەنجامم دا ئەوەبوو، هەڵسامەوە سەرپێ، سەرسامییەكی سەیر بەسەرم زاڵبوو، من پێشتر شتێكی وەهام بەسەر نەهاتووە، تەنانەت سەبارەت بەشتە بچووكەكانیش: وەك ئەوەی لەسەر كورسی بخەوم، كاتێك هەڵسامەوە و ژیر بوومەوە، تێبینی ئەوەم كرد دەمانچەكە پر فیشەكە ئامادەیە- بە خێرایی لەخۆم دوورخستەوە. .. ئاخ ژیان... ژیان! دەستەكانم بەرزكردەوە بۆ هەقیقەتی ئەبەدی پاڕامەوە. تەنانەت بەكوڵ دەگریام، گریانێك سنووری نەبێت، هەموو بوونی منی بەرزكردەوە. بەڵی دەبێ بژیم و موژدەبەخش بم!

ئاخ لەبارەی موژدەبەخشییەوە، هەمان سات خۆم یەكلاكردەوە، هەڵبەتە تا كۆتایی ژیانم!

وەك موژدەبەخشێك دەردەكەوم، دەمەوێ موژدە ببەخشم.. بەڵام بەچی؟ " بە هەقیقەت!" ئەو هەقیقەتەی بینیومە، بە چاوەكانم بینیومە. تەواوی شكۆی ئەو هەقیقەتەم بینیوە!

بەمشێوەیە لەوكاتەی موژدە دەبەخشمەوە! دەمبینن هەموو ئەو كەسانەم زیاتر خۆشدەوێ كە گاڵتەم پێدەكەن. — بەڵام بۆچی، لێكدانەوەیەكم بۆ ئەوە نییە- با وا بێ چ زیانێكی هەیە! پێم دەڵێن ئێستا من ڕێگام ون كردووە. مادامەكی كردم، ئێستا

بەکوێ دەگەم؟ ئەمەش هەقیقەتێکە نکۆڵی لێ ناکرێت: رێگام ونکردووە. بابەتەکان لەئاییندەدا خراپ دەبن. گومانی تێدا نییە من بەر لەوەی رێگای راست بدۆزمەوە چەندین جاری دیکە گومڕا دەبم. دەزانم دەبێ چۆن موژدە ببەخشمەوە. بە چ گوفتار و رەفتارێك. چونکە ئەمە زۆر ئەستەمە. من دەزانم ئەوە هەر لە ئێستاوە وەك رۆژی رووناك دیارە. بەڵام گوێبگرن: کێ لە ئێمە رێگا ون ناکات! کەچی هەمووومان بەرەو یەك ئامانج دەڕۆین. یان با بڵێین هەمووومان بەرەو یەك کۆتایی دەچین. هەر لە دانایەکەوە تا تاوانبارێك. جا هەرچەندە رێگاکان جیاواز بێت. لەوانەیە هەقیقەتەکە کۆن بێت. ئێستا نوێیەکە بۆ ئێوەیە: من هەرچەندە فریو درابم. ئەمە ماوەیەکی زۆر نییە هەقیقەتەکەم بینیوە. بینیم و زانیم مرۆڤ دەتوانن نایاب و کامەران بن. بێئەوەی توانستی ژیان لەسەر گۆی زەوی لەدەست بن.

من نامەوێ و ناتوانم باوەڕ بەوە بهێنم گوایە شەڕانگیزی لە سروشتی مرۆڤە. کەچی ئەوان هەموویان گاڵتە بەم باوەڕەی من دەکەن. بەڵام چۆن دەکرێت ئەم باوەڕم نەبێت: من هەقیقەتەکەم بینیووە. بابەتەکە لەزەینم دروستبووە. بینیومە. بینیومە. تا ئەبەد روحم لە نموونە زیندووەکەی ئەم هەقیقەتە تەژیبووە. درەوشانەوە رەهاکانی ئەم هەقیقەتەم بینیوە. باوەڕم

بەوە نییە ئەمە لە لای مرۆڤ بەرقەرار نەبێت. بەمشێوەیە: چۆن گومڕا نابم؟ تووشی لارێ دەبم. هەڵبەتە ئەمە زیاتر لەجارێك روودەدا. قسەی سەیر دەكەم. بەڵام بۆماوەیەكی زۆر نا: ئەو نموونە زیندووەی بینومە هەمیشە لەگەڵم دەمێنێتەوە: راستم دەكاتەوە و رێنماییم دەكات. ئەها ئەوەتا من ئازام. لە هەرەتی لاوییم. دەرۆم و دەرۆم ئەگەر بۆ هەزار ساڵ بێت. ئایا دەزانن لە سەرەتا دەمویست هەواڵی خراپكردنی ئەوان لەئێوە بشارمەوە. ئەمەیان هەڵە بوو. یەكەم هەڵەی من بوو!

بەڵام هەر زوو هەقیقەت منی خستە دڵەڕاوكێ: ئەوا من درۆ دەكەم. دواتریش هانی دام و هەڵەكەی منی راستكردەوە. چۆن دەكرێت بەهەشت دروست بكەین. نازانم. چونكە ناتوانم بە وشە گوزراشتی لێ بكەم. دوای خەونەكەم وشەكانم ونكردووە. بەلای كەمەوە تەواوی وشە سەرەكییەكان. كەزۆر پێویستن. هەر چۆنێك بێت دەرۆم و بێ سڵكردنەوە قسە دەكەم. من بەم دوو چاوەی خۆم بینیومە. تەنانەت ئەگەر نەشتوانم وەسفی بینراوەكەم بكەم.

لە هەموو حاڵەتەكانیش گاڵتەچییەكان تێناگەن: " خەونە. هورێنەیە. زیندە خەونە" ئایا ئەمە شتێك دانایی تێدایە؟ زۆر شانازی بە قسەكانیان دەكەن! خەون؟ خەون چییە؟

ئایا ژیانی ئێمە زێتر لەخەونێك چییە؟ زیاتریش لەمە دەڵێم: با هەموو ئەمانە نێتەدی، بەهەشتیش هەرگیز نەبێت (تەواو لەوە دەگەم) بەڵام مـن سـەرەڕای ئەمەش وەك موژدەبەخشێك دەست پێدەکەم، سەرەڕای هەموو شتەکان ئەمە ئاسانترین بابەتە: لەوانەیە لەیەك ڕۆژ، تەنانەت یەك کاتژمێر، هەموو شتەکان بەوپەڕیی خێرایی بونیاد بنێتەوە، گرنگ ئەوەیە کەسانی دیکەت خۆشبوێ بەقەد ئەوەی خۆت خۆش دەوێ، ئەمە بابەتی سەرەکییەکەیە، کە شتێك هاوشانی نییە. کاتێك ئەمەتان بەدەستهێنا، بەهەشت دروست دەکەن. هەر بەم بۆنەیەوە ئەمە هەقیقەتێکی کۆنە، مرۆڤ لەمێژە خوێندویەتەوە، ملیاران جار دەیگێڕێتەوە. کەواتە ئەی چۆن لەگەڵ ئەم بیرۆکەیە دەژی کە دەڵێ: هۆشیاری ژیان لەسەرووی خودی ژیانە، ناسینی ڕێساکانی کامەرانی لەسەرووی کامەرانییە- ئەوەی دەبێت خەباتی لەدژدا بکەم بەدیارکراوی ئەو بیرۆکەیە! منیش ئەو کارە دەکەم. ئەگەر شتێك هەمووان ئارەزووی بکەن، ئەوان لە چرکەساتێك دێتەدی.

سەبارەت بەکیژۆڵەکەش ئەوا دەیدۆزمەوە.... دەڕۆم... دەڕۆم و دەڕۆم!

کۆتایی . . .

